ئەسڵەن تـورك ئەوەنـدە دەسـەڵاتدار نەبوويـنـەو ئيمتيـازى زيـادى نـەبوە ئەگـەر كەمتريش نەبووبێت، بۆيە ناوى (تورك) زياتر هاوتاى (أعرابي) بووە [١]، هەتا لە كوردسـتانيش نـاوى سـەربازى عوسمـانلى بـە تـورك نـەهاتووە لـەبارە هـەرە خراپەكانيش لە كوردستان ناويان بە (جل خوارەكان) يان (گورگەبۆرەكان)[٢] ناوو نازناوى هـيـچ خەليفەوسـەركردەيەك بـە تـورك نـەهاتووە، (د. قوتيبـە شـهابى) فەرهەنگێكى دەگمـەنى لـەناو نازنـاوى خەليفـەو پادشـاو سـوڵتانو واليـەكانى مێژووى ئيسلام كۆكردۆتـەوە بـەناوى (معجم ألقاب أرباب السلطان في الدول الإسلامية من عصر الراشدي حتى بدايات القرن العشرين).. لـەو (معجم)ەدا تەنيا نازناوێكى نەتەوەگەرى يان رەچەڵەكى تيا نيە وەك شانازى بـە عەرەبايـەتى يان بە توركايەتى يان بە كوردايەتىو فارسايەتى.. كرابێ، تەقەلايەكى تريش لەو شێوە لە لايـەن (ساطع حصري) كـراوە، ئەنـدامانى پەرلـەمانى (مەبعووسـان) نوێنەرى نەتەوەو ويلايەتەكەيان نەدەكرد بەڵكو هەريەكە بەپێى مـادەى (٧١)لـە دەستوورى عوسمانى (مەشرووتيەى يەكەم) نوێنەرايەتى هەموو ميللەتى عوسمانى دەكرد، تەنانەت لە دەزگاى رەگەزنامـەى عوسمانليـەكان نـاوى نەتـەوەيى تۆمـار نەدەكرا، يەكەمجار هێماى (ع)* لەبەرامبەر ئەفسەرە عەرەبەكان دانرا لەسەردەمى ئيتحاد والترقي بـوو لـەدواى ١٩٠٩، بۆيـە خەلافـەتى ئيـسلامى لـەو ديـاردەو تاوانانە بەرپرس نيـە، بەپێـچەوانە هـەر لەگـەڵ ئـەمانى دەسـەڵاتى خەلافـەتو سـەرهەڵدانى فيكرى عەلمانيەتو نەتەوەگەرى پەيدا بـووە، هـەر بۆيـەش دەبيـنين ئەخشەى كوردسـتانى ئێـستا بـەهۆى پرۆسـەى پاكتـاوى رەگـەزى نـاوا بـچووك بوويتەوە، ئەونەخـشەيەى لايـەنى كـوردى بـڵاوى دەكاتـەوە ئـەو ئەخـشەيە لـە سەردەمى خەلافەت بووە.

[١] بۆ زياتر سەرنج بدە (ساطع حصري- محاضرات في نشوء القدهة).
[٢] بۆ زياتر بڕوانە: (ياداشتەكانى- رفيق حلمي).
* واتە عەرەب، گوايە ئەو ئەفسەرانە گومانى ئەوەيان لێدەكرا كە پەيوەنديان بە سوپاى هاوپەيمانان هەبێ لە جەنگى جيهانى يەكەم

نەخشەی کوردستان لە سەردەمی خەلافەت لە چەندین سەرچاوە هەیە، بۆمـان دەستنیـشان دەکـەن وەك سـیاحەتنامەی ئـەولیا چـەلەبی (لـە سـەدەی ١٧)، گەریدەکانی ئیبن بەتوتە، معجم البلدانی یاقووت حەمەوی، (شەرەفنامە) کە لە سەدەی (١٥٤٣-١٦٠٣)، لە کتێبی (کوردو کورستان- ئەمین زەکی بەگ-سەدەی بیستەم)، لـە رێکەوتنامـەی سـیڤەری١٩٢٠ بەنـدی (٦٢) بەشـەکانی سـەروو و خواروو دیاری دەکات، هەروەها لیژنەی (تحکیمی موصل) کە لـە ١٩٢٤/١٠/١٣ دروست ببو پێکهـاتبوو لـە (ڤۆنـت نیکلی، موسـیو برسـت، کولومـل پـولس) راپۆرتەکەیان لە ١٩٢٥/٧/١٦دا (عصبة الأمم) تیایـدا هـاتووە: نـاو موصـڵیس کوردی زیاتر بووە بە رێژەی ٨\١٥ یان بـە پێـی هەنـدێ سەرچـاوەی تـر ٨\١٧، لـە هـەولێر رێـژەی تورکمـان ١,٥٪ هەرچـەندە لـە سەرانـسەری (سـەرژمێریەکە) کوردێکی زۆر ناونووسی نەکرابوون لە ترسی سەربازی کردن.[1]

ئنجا بەڵگەنامەکانی تـری مێـژوویی، لەوانـە ئـیبن خلـدوون (جبـل حمـرین)ی ئێستای کە زیاتر لە ١٠٠کم لـە کوردسـتان دوورکەوتۆتـەوە بـە (جبـل الأکـراد) ناوبردووە، هەروەها زۆر لەناوی شاخەکانی.. هەتا لە لبنان لە نزیك (مرجعیـون) (جبل الأکراد)و زۆر ناوی تری کوردی لێ هەیە، لە میسریش زۆر لەناو ئیـداری و سەربازیو کوردین..، لە نەخشە کۆنـەکانی ئیـسلامی (ئیدریـسی) (مـسعودی) (ئەلبیرۆنی) (ئستخاری)[2]،.. ناوو خاکی کوردسـتانی لێ تۆمـار کـراوە لەبـەر گەورەیی، زۆر سـەرچاوەی تر لەبەر بەهێزی شەخسیەتی کورد بەدرێژایی خەلافـەت وا هەستیان کردووە کە میللەتانی تـری عـەرەبو تـورکو تورکمـان و ئاشـووریو کلدانیو کەمایەتی تـر تواوەتـەوە، لەوانـە (تۆمـاس بـوا) دەڵـێ: تـا سـەرەتای

١ بە درێژی لە (کوردو کوردستان) ئەمین زەکی بەگ بخوێنەوە.
٢ بۆ زیاتر سەرنج بدە: نەخشەکانی ئەوانە لە (العراق في الخوارط القدیة )، هەروەها بروانە: (أطلس حضارة الإسلامیة).

بيستەميش (تورك) لەناو كورد دەتوايــەوە[١]، هەڵبەتــە تــورك‌و توركمــان لێــك جيان، رايەكى فراوان وا دروست بووە گوايە توركمانى كوردستان پاشماوە پاكتــاوى رەگەزيى عوسمانليەو رەچــەڵەكيان توركيــە، يــان پيــاوى تــورك (turk-man).. نــەخێر ئەوانــە لــە دووريێگــە هــاتوون، يەكــەميان بــۆ كرێگرتــەيى بەتايبــەتى لەسەردەمى عەباسيەكان وەك ســوپاى ئــازاى جــەنگى بــەكارى دەهێنــان، دووەم لەگەڵ هێرشەكانى مەغۆل‌و تەتەر.. هاتوون لە ناوەڕاستى ئاسيا هــەروەك (ابــن خلدون) جوانتر هەردوو رەگەزى تــورك‌و توركمــانى لێــك كردۆتــەوە هــەتا لــەناو توركياش توركمان جيابوونە..

هەڵبەتە پتــەوى شەخــسيەتى كــورديش نيــشاندەرى پتــەوى بــارى سياســى و كۆمەڵايەتى‌و مێژوويى‌و جيوپۆلۆتيكى‌و هێزى سەربازى بووە، باشترين بەڵگــەش هەتا سەرەتاى سەدەى بيستەم (سەيدەكان)يش لەناو كــورد تواونەتــەوە، دەبيــنين هــەتا لــەناو فــارس كــە خــاوەن شەخــسيەتى بــەهێزى مێــژووين نەتواونەتــەوەو ئيمتيازى كۆمەڵايەتيان هێشتا زۆرە، هەروەها ئاشــورى‌و كلــدانى و لــەناو كــورد تواونەتەوە..، تا ئەو ساتەش كە كورد دوو حكومــەتى بــۆ خــۆى دروســت كــردو شەخسيەتى نەگەيشتۆتە نيوەى ئاستى ئەو ســەردەمى.. چــاكترين نمونــەى لاوازى ئێستا ديارەدى كۆچكردن‌و هەڵوەشــانەوەى ئينتمــاى نيــشتمانيە بــە ســانايى..، ئەوەش كۆمەڵێك هۆى ديارىكراوى هەيــە، سيــستەمى سياســى‌و كۆمەڵايــەتى‌و فيكرى‌و تا دەگاتە ڕاگەيانــدن لێــى بەرپرســيارن كــە نــەتوانراوە بينــاى مــرۆڤ و شەخسيەتى كورد دابڕێژنەوە..، دەتوانين بڵێين لە هەموان زيــاتر نــەريتى سياســى كورد تەعريب كراوەو دەســەڵاتى كــورديش تــا ئــەو ســاتەى نووســينيش هێــشتا وێچووى دەسەڵاتى سياسى عەرەبە كە بە سفر وەسف كراوە، هەروا لــەرزۆك بــووە بەهۆى ئەو كۆمەڵــە شكــست‌و چەواشــەكارى‌و فريودانيــەى لــە چــەپ‌و ڕاســت، سەروو خواروو، دەرەكى‌و ناوەكى... بينيوە.. ئيتر ئەو دۆخە زەمينەيەكى ســانا

١ تۆماس بوا - (تأريخ الاكراد) ل١٩٧.

ساز دەدا بۆ سەرکەوتنی پاکتاوی رەگەزی بەسەریدا.

لە کۆتاییدا ماوە بڵێین پاکتاوی رەگەزی نەك هەر لە فیکری ئیسلامیو فیکرەکانی تر هەتا لە فیکری نەتەوەگەریش جێگەی شەرمە، بۆیە بۆ پێکەوەژیان لە دەوڵەتی نەتەوەییش چەمکی (هاوولاتی) دروست بوو کە فراوان ترە لە نەتەوەو رەچەڵەك، لەرووی یاسایی بەشێکی چاکی لە کێشەکانی کۆمەڵایەتی چارەسەرکردووە کە لە بنەچەدا لە دەوڵەتی ئیسلامی پەیڕەو کراوە..

( ٣٩ )

# راگەیاندنی بە ئامانج     اعلام الهادف
# Obiective Media

راگەیاندن لـە بنـچینەدا مانـای بڵاوکردنـەوەی راسـتیەکانە وەك خـۆی، جـا رووداون یـان دیـاردەو پەیوەنـدی کۆمەڵایـەتیو سروشـتیو سیاسـین.. یـاخود مێژوویی.. ئەوەیان پێناسێکی زانستی تەواوە بۆ کۆمەڵگەیـەکی پێگەیشتوویی ترازی (ئومەت) بێت بە هەموو مانـاو تـاوەرۆكو نیـشانەکانی، لـەو کاتـە ئـەو راگەیاندنە تەنیا ئـەرکی بڵاوکردنـەوەی رووداو دەنـگو باسـەکان وەك خۆیـەتی، بەڵام لەو ئاستە بەخوارەوە واتە کۆمەڵگەیەکی پێ نەگەیشتوو ئەو راستیانەش لێ دەبێتە دەرد، بۆیە راگەیاندنیش لەو دۆخانە زیاتر لایەنی رێباز وەردەگرێـت نـەك زانـستی، لێـرەدا راگەیانـدنی ئامـانج دار لـە راگەیانـدنی بـەرەڵا بـەوە لێـك جیادەکرێتەوە یەکەمیان هەموو شتێك بڵاو ناکاتەوە.

**بنەچەکەی:** لە هەموو سەردەمێك بەپێی بارودۆخی کۆمەڵایەتیو هونـەری سەردەم راگەیاندن رۆڵی خۆی بینیوە، نوسەرو شاعیرو قـسەزان بـۆ دەسـەڵاتدارە سیاسیە جۆربەجۆرەکان پارسەنگ بووینە لە دروست کردنی رای گشتی بۆ چـاکەو خراپە، بانگەوازو ئاگاداریەکان لەرێی پیاوە دەنگ بەرزەکان بڵاوکراونەتەوە، بەڵام (راگەیاندنی بە ئامانج- اعلام الهادف) جگە لە پێغەمبەرەکانو درێژکراوەی ئـەو بەرنامە کۆمەڵایەتیو سیاسیانە کەمتر هەبووە، هەرچەندە لە مەدرەسەی یۆنـانی هەندێ رێنمای لەو بارەیەوە لە کتێبی (جمهورية- کۆماری) ئـەفلاتوون هـاتووە.. تیایـدا دەڵـێ‌بـاس کردنـی هـەموو شـتێك لـە (راگەیانـدن) بینـای کۆمەڵگـە

دەرووخێنێ، هەتا ئێستاش ئەگەر دەزگاو حکومەت ولایەنی سیاسی بۆ بەرنامە بۆ ئەوا راگەیاندنێکی تەواو بەرەڵای هەیە بۆ گوێدانە سەرەنجامەکانی، بۆیە لە ئەزموونی بەشەری بەتایبەتی لە رۆژئاوا کەمتر ئەو دوو مانایەی راگەیاندن بەجیایی بەدی دەکرێ، هەر تەنیا سەرچاوەی هەمووی (ئینگلیزیەکەی، فەرەنسی، ئەڵمانی...) زۆربەی ئەوروپی لە (information)ی لاتینی هاتووە بە مانای (دەنگو باسو روون کردنەوە بۆ خەڵکی).

لەگەڵ پەیدابوون وگەشەی تەکنیك وئامراز راگەیاندن گەشەی کردووە وەك (چاپ، رادیۆ، تەلەفزیۆن، تا دەگاتە ئینترنیت..)، بەم شێوەیە:

• چاپ لەساڵی ١٤٣٦از دۆزراوەیەوە لەلایەن چۆتنبرخ[1] دوای کەمێك سینەماش دۆزرایەوە لەلایەن ئەدیسۆن.

• وێنە لە ساڵی ١٨٢٢ دۆزرایەوە.[2]

• بروسکە لە ساڵی ١٨٣٨ دۆزرایەوە.[3]

• رادیۆش لە سەدەی (١٨) سەربردەی دەست پێدەکا، بەڵام لە سەدەی بیست ئیزگەی رادیۆیی دروست بوو بەپێی (الإعلام الدولي والعلاقات الإنسانية)، بەپێی (موسوعة العربية)ش لەساڵی ١٨٩٥از ئێزگە دەستی بەکارکردووە (هەر نزیکە لێك).

• تەلەفزیۆن: بەپێی (تأريخ الصحافة)و (الاعلام...- د.یوسف ابو هلالە) ئەوا یەکەم تەلەفزیۆن لەساڵی ١٩٢٦ لەلایەن (جۆن بیرد) دامەزرێنرا، یەکەم پەخشی تەلەفزیۆنی لەساڵی ١٩٢٧ لەنێوان واشنتنو نیویۆرك بووە، لەساڵی ١٩٣٦ تەواو کەوتە کار، بەپێی (الموسوعة العربية)ش لەساڵی ١٩٣٤ کەوتۆتە کار، هەتا ساڵی ١٩٥٠ تەنها پێنج وڵات تەلەفزیۆنیان هەبووە.

---

[1] الإعلام الدولي والعلاقات الإنسانية.

[2] الموسوعة العربية.

[3] الموسوعة العربية.

● یەکەم بڵاوکراوەی دەرەوەیی (بەپێی الاعلام الدولی...) بەناوی (لاگازیت) بووە، زۆرسەرچاوە یەکەم رۆژنامە بۆ ئەزموونی چین دەگێرنەوە، بەپێی (الموسوعة العربیة...)ش هەر لەدوای دۆزینەوەی چاپ یەکەم رۆژنامە لە ئەڵمانیا لەساڵی ١٦٠٩ز دەرچووە، یەکەم گۆڤاری زانستیش لەفەرەنسا لە ١٦٦٦ز دەرچووە، [1] یەکەم رۆژنامەی عەرەبیش لەساڵی ١٨٢٨ز لە سەردەمی محمد علی پاشا لە میسر دەرچووە بەناوی (الوقائع المصریة)،لە بەغداش یەکەم رۆژنامە بەناوی الزوراء لە ساڵی ١٨٦٩ز ژمارەی یەکی رۆژی سێ شەممە لە سەردەمی داوود پاشا دەرچوە .

تا گەیشتە ئەو رادەیە لە سەردەمی سۆڤیەتی پێشوو تەنها لەو وڵاتە ٦٣٩ رۆژنامە دەردەچوو، هەندێکیان تەنها تایبەت بوون بە دژایەتی ئایینیو ئیسلام لەوانە (المآخذ اسلام)، (دین اسلام)، (فینم دین).. رۆژنامەی وا هەبوو رۆژی سێجار بەسێ رەنگی جیا دەردەچوو وەك لەوەی چین بەناوی (کین یان) [2]، سەرەرای ئەو ئاژانسانەی وەك: رویتر، ئەسوشیتدپرێس، .. ئەو دەزگایانەش هەروا تا ئیستاش بەکارن، چونکە لە سەرەتادا کە رادیۆ دۆزرایەوە وتیان (ئیتر کاری رۆژنامەو چاپ تەواو) کە تەلەفزیۆنیش پەیدابوو وتیان کاری رادیۆش تەواو، کە کۆمپیوتەرو ئنتەرنێتیش هات وتیان ئیتر چاپو رادیۆو تەلەفزیۆنو مەکتەبە تەواو دەبێت کەچی هەمووی وا شان بەشانی یەك بەکارن لەو جیهانە.

**لە پێناسە سەرەکییەکانی دا:** راغب ئەسفەهانی (اعلام)ی بەهاوتای (اخبار) ریزکردووە، وەك زاراوەش دەڵێ: ((هو نشر الحقائق والمعلومات الدقیقة الصادقة بهدف التنویر والأقناع))، هەڵبەتە ئەوە پێناسێکی نزیکە لە (اعلام الهادف) نەك ئەو راگەیاندنەی شێوازی میکاڤیلیو هتلەری کە ئێستا زۆربەی وڵاتانو حزبە عەلمانیەکان پەیرەوی دەکەن.

---

[1] تأریخ الصحافة، الاعلام..
[2] بۆ زیاتر سەرنج بدە (الاعلام...) هەروەها (الاعلام الشیوعي المعاصر).

هەرچی (الاعلام...)ی (د.یوسف ابو هلاله) وای پێناس کردووە: ((استعمال وسائل الأعلام وأساليبه كافة ضمن حدود الشرع لبيان الحق، ودعوة الناس وتعرية الباطل وصدهم عنه، لئلا يكون للناس في البعد عن الإسلام حجة.))

لە کتێبی (الإعلام في ضوء الإسلام) هاتووە: ((هو نشر الحقائق والأخبار والأفكار والآراء في وسائل الإعلام المختلفة.))

راگەیاندن لە کۆنو ئێستاشەوە هەروا رۆڵی گرنگ تر دەبێت بەهەموو ئاراستەیەك، بە سەلبیو ئیجابیشەوە، ئامرازێکی دووڕووە، دەتوانی خزمەتی مەزن بۆدروست کردنی رای گشتیو وشیاری خەڵکی پێ بکرێو دەشتوانرێ چەواشە بکرێ، مەرج نیە راگەیاندنی چەواشە هەموو دەم درۆو هەڵخەڵەتاندن بێت، جار وایە دەنگو باسی راستیش بڵاو دەکاتەوە یان داوایەکی راستیش بکا مەبەستەکەی چەواشەکاریو وێرانیە، ئیمام عەلی ناوی لەو ترازە ناوە ((كلمة الحق يراد بها الباطل))، تا لێرەدا پێناسی راگەیاندنی لیبرالی روون ترە کە بە سادەییەکەی ئەوەیە : هەموو جۆرە دەنگو باسێك بڵاو دەکاتەوە بێ گوێدانە بیناکردن، ئەوەش لە چوارچێوەی مەبادیئەکانی لیبرالی دێت کە (سەربەستی تاکەکەس لەسەر حسابی سەربەستی کۆمەڵ)ی زیادکردووە، بەگشتی ئەوانە بەناوی (رارەوی تاك- مذهب فردي) دێت، چونکە روداوەکانیش بەگشتی دوو بەشە، یەکەمیان پەندو وانەی پەروەردەی وان مرۆڤی پێ بینا دەکرێ، بەشی دووەمیان وێران کردنو فێرکردنی تاوانو نادڵسۆزیو نیشتمان فرۆشیو بەرژەوەندی پەرستیو خۆویستی...هتد، راگەیاندنی (هادف) تەنها بەشی یەکەم هەڵدەبژێرێ بۆ بڵاوکردنەوە، دووەمیش تەنها دەتوێژێتەوەو تایبەتی دەکا بۆ پسپۆڕان، واتە دەنگو باسو رووداوەکان بەسەر ئاستەکان دابەش دەکا، هەریەکە بەشی خۆی دەداتێ تێکەڵی ناکا، بەشی توێژینەوە لە دیاردە سەلبیەکان تایبەت دەکا بۆ پسپۆڕان نەك بۆ عەوامی خەڵك، تەنها دەنگو باسە پەروەردەییەکان هەڵدەبژێرێ بە هەوادا بۆ گشتی بڵاودەکاتەوە، کە خزمەتی ستراتیجیەتی بەرنامەی بینای

کۆمەڵایەتیە، ﴿وَإِذَا جَاءَهُمْ أَمْرٌ مِنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُوا بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُولِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنْبِطُونَهُ مِنْهُمْ وَلَوْلاَ فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لاَتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلاَّ قَلِيلاً﴾، بۆیە راگەیاندنی (هادف) تەنیا مولکی (ئاینی) یان فیکری ئیسلامی نیە، بەڵکو زۆربەی بەرنامە خاوەن ئایدیۆلۆژیەکان بەجۆرێك لە جۆرەکان وان، بەڵام نەك وەك راگەیاندنی شیوعیەت کە سانسۆری وا تەسك کردبۆوە تەنها (وەك خۆیان دەڵێن) لە خزمەتی شیوعیەت بێت، هەتا سانسۆری خستبووەسەر دەنگو باسی زانستیش، نەدرێسی سەیر سەیر پەیدا ببوو وەك فیزیای پرۆلیتاریا، زانستی برجوازیانە، زانستە مەیل میتافیزیکەکان، گەردوونی مەیل میسالی.. یان وەك هەڵمەتەکانی ستالینو ماوتسی تۆنگ بەناوی زانستیش چینایەتیە!

ئەو جۆرە تێڕوانینو سانسۆرە راگەیاندنێکی (هادف)ی سەلبی دروست کردبوو کە تەنها رێی بەو دەنگو باسانە دەدا کە لە خزمەتی حزبایەتیە تەسکەکە بوو، یان لە خزمەتی دەسەڵاتداران نەك لە خزمەتی بینای کۆمەڵایەتی بێت، ئێستاش ئەو ئاسەوارەی ماوە زۆرێك لە حزبە عەلمانیەکانو ناوەندو دەزگاکان تەنیا ئەو جۆرە دەنگو باسو توێژینەوانە هەڵدەبژێرنو بڵاودەکەنەوە کە چۆن خەڵکی وا رابێنن لە کۆتایدا لایەنگری ئەو جۆرە دەسەڵاتدارانە بکەن بە خۆشی یان ناخۆشی، راگەیاندنێك کە خەڵکی بەرەو عەوامیەتیو مێگەلیو ناوشیاری دەبا، ﴿فَاسْتَخَفَّ قَوْمَهُ فَأَطَاعُوهُ...﴾، تەواو پێچەوانە لەگەڵ راگەیاندنێك کە خەڵکی دروست دەکا بەرەو مەدەنیەتو ئومەتو وشیاری، .. بەپێی هەردوو ئایەتی پێشووش نە راگەیاندنێکی بەرەڵا بە رەهای نە بە سانسۆرێکی مقەسی تیژ پۆزەتیڤن، ئیتر ئەوە ماناکەی روونە کە هەتا دەنگو باسیش نابێت بێ سانسۆر بڵاوبکرێتەوە، سانسۆرێکی گەردوونی تەرازوو بالا نەك سانسۆرێکی سیاسی، سانسۆر ناوبانگی زراوە بە سەلبی کاتێ دەبێتە چاودێر لەسەر راگەیاندنو نووسینو بیروبڕوای بەرامبەر، بەڵام سانسۆر لەسەر راگەیاندنێکی دژ بە بینای

کۆمەڵایەتی زۆر پێویستو نیجابیە، جار وایە ئەوانە تێکەڵ دەکرێنو بە هەڵچوانە رایەك دەگوترێ، با میللەت هیچی لێ نەشاردرێتەوە..! ئەوە هەڵەیە هەرچەندە لە کاردانەوەی دیکتاتۆریەتی راگەیاندن وا هەڵدەچێ، چونکە هەموو لایەك لە توێژەوەرەکان کۆکن کە راگەیاندنو کاریگەریەکانی لەژێر رۆشنایی سۆسیۆلۆجیو ئەنسرۆپۆلۆجیو فەلسەفەو تیۆری سیاسیشدا دەبێ ئامانجی هەبێت، پەروەردەو رێکخستن بێت، بە روانگەی یاسا بنچینەییەکانی کۆمەڵایەتی، یاسای تاوان، تایاسایی سیاسیش.. جەخت لەسەر ئەوە دەکەن بڵاوکردنەوەی دەنگو باسە سەلبیەکان هاندانی خەڵکە لەسەر کاری سەلبیات،کە خێراتر کار لە مرۆڤ دەکا هەروەك تێکدان بەگشتی لە سیستەمی ئەو گەردوونەماندا ساناترو خێراترە لە بیناکردن، مرۆڤیش هەروا لایەنی شەڕی ساناتر دەوروژێ نەك لایەنی خێری (بەتایبەتی عەوام)، بۆیە دەنگو باسە تێك دەرەکان کاری گەری خێراتر دەبێت لەسەر خەڵکی، جا دەبینین بەشێك لە راگەیاندنەکانی (رۆژنامەگەری، کەناڵەکان، نووسین..) ئەو رووکارە دەگرێتە بەر بە مەبەستی ناوبانگو بازاڕ لەسەر حیسابی ئەو بینا ستراتیجیە، یان ئۆرگانی حزبو دەزگایەك کە دەست کورتە لە بەرنامەی کۆمەڵایەتیو بیناکردن ئەوا قەرەبۆی بێبازاریەکەی بەو شێوازە راگەیاندنە دەکاتەوە، کە لەدوای خوردکردنەوەیەك هەمان مانای بەرژەوەندی تایبەتی خستنە سەر بەرژەوەندی گشتیە، بابە ناوی: سەردەم سەردەمی ئازادیە، دەبی راگەیاندن ئازاد بێت.. نەخێر بۆ هەموو شتێك دەبێ پێوانەو یاسا هەبێت، یاسای چاپەمەنیو وەزارەتی راگەیاندن تا رادەیەك شایستەیە ئەگەر نەبێتە دەردی پاوەن کردنی ئازادی، لەو بارەیە زۆربەی وەزارەتەکانی راگەیاندنی وڵاتە دیکتاتۆرەکان ئەو ئەرکەی سانسۆری ئازادی پێ سپێردراوە هەروەك وەزارەتی ئەوقافو وەزارەتی رەوشەنبیری... بەڵام هەندێ وڵاتیش هەیە وەزارەتی راگەیاندنی هەر نیە وەك ئەمریکا، بۆیە چینەکانی کۆمەڵ خۆیان لەوانە چاتر ئەو چاودێرو سانسۆرە مەدەنیە بن، هەتا یاداشت وسکاڵای خۆشیان هەڵبژێرن بەو تەرازووە هەمووی

بڵاونەکرێتەوە، با لە سەرحسابی مافی خۆشی بێت، سەرنج بدە سەربردەی ئەو (شێخە-دەڵێن ئەو شێخە راوێژکاری صلاح الدین ئەیوبی بووە) زۆر گرنگە بۆ ئەو بابەتە،وادیارە لەو کاتی سەرقاڵی دووبارە دروست کردنەوەو بیناکردنەوەی کۆمەڵگەی ئیسلامی بووینە، چۆن لەگەڵ ئەو بەسەرهاتە رەفتار دەکا بە لێزانیو رەچاوی بەرنامەی بینای کۆمەڵایەتیو راگەیاندنی بەئامانج دەکا، ئەو شێخە بە سواری وڵاخ لەرێگەی تووشی کەسێك دەبێ خۆ بە نەخۆش دەردەخا، شێخ داوای لێ دەکا کە لەگەڵی سوار بێت، نەخۆشەکە دەڵێ من ناتوانم بەجووتە سوار بین لەبەر نەخۆشیەکەم، شێخیش دادەبەزێو نەخۆش بە تەنها سواری وڵاخە بەنرخەکە دەبێتو (وەك دز نەك نەخۆش) بۆی دەردەچێت، شێخەکە بانگی دزەی کردو وتی ئەی دز وڵاخەکە بۆ خۆت، بە یەك مەرج، دزەکەش گەڕایەوە بە سەرسوڕمانەوە وتی: ئەو مەرجە چیە؟ شێخ وتی: تەنیا مەرجم ئەوەیە لای کەس باسی مەکە، دزە وتی: من هەقی تۆم بردووە، خۆ باس کردنی قازانجی تۆیە.. شێخ وتی: بەڵێ قازانجی منە، بەڵام بە زیانی کۆمەڵگەکەم تەواو دەبێ، بە بڵاوبوونەوەی ئەو دەنگو باسە چیتر خەڵکی لە رێگەویان بۆ نەخۆش راناگرنو چاکە کەم دەبێتەوەو پیاوەتیو ئەخلاقو هاریکاری لەرزۆك دەبێتو بناغەی کۆمەڵگەشمان لەرزۆك دەبێت.

ئەگەر سەرنج بدەین رووداوێکی پڕ لە پەندو وانەیە بۆ بیناکردنەوەی کۆمەڵ، چونکە بڵاوبوونەوەی ئەو جۆرە دەنگو باسە هەڵتەکاندنو سەلبیە کارێکی قووڵ لە گیانی هاریکاریو بەزەییو بەهاناهاتنو متمانەو ئەخلاقو مرۆڤایەتیو خۆنەویستی.. دەکا چونکە هەر مرۆڤ خۆشی بە هەنجەتە لێی، پێچەوانەکانی زیاد دەکا لە بێبەزەییو خۆویستیو بەرژەوەندی تایبەتیو ئەنانیەتو دڕندایەتی ودڵ رەقی.. وەك ئێستا لە کوردستانیش ئەو دیاردە پێچەوانەیە بڵاوە، جاران کورد ناوبانگی بەوە دەرکردبوو کە میللەتێکی بەهاریکارو بەهاناو رووخۆش لەگەڵ میوانو بەزەییو چاکەو.. کەچی راگەیاندنێکی پێچەوانەی (هادف) یان

بێ‌خاوەنی لە (راگەیاندنێکی هادف) چەند روداوێکی راستەقینەو هەندێکیش هەڵبەستراو بەخێرایی بڵاوکرایەوە (رای گشتیەك)ی سەلبی وای وەرگرت کە گوایە چاکە لەو زەمانە دەبێتە خراپە، ئەوەیان بەسادەیی دێتە بەرچاو، بەڵام گەلێ گرنگەو داگیرکەران‌و دوژمنانی کوردیش بێ‌تاوان نین، بگرە بە بەرنامەی دارێژراو نامانجدارانەو تێکدەرانە پەیڕەوی ئەو پلانەیان کردوەو دەیکەن، خەڵکی سادەش کەمتر هەست بە ترسناکیەکەی دەکەن، لە ئەنجامە هەرە سەرەتاییەکانیشی ئەوەیە کەس ناتوانێ چاکەو هاریکاری لەگەڵ کەس بکا، ئیتر بناغەکانی کۆمەڵگە، گەل، نەتەوە، کۆمەڵگەی مەدەنی، .. ئومە، .. هەرچیەك هەیە تێك دەروخێ، بۆیە لە شەریعەتی ئیسلامدا حوکمی تاوان ئەوکاتی چەند قات گەورەتر دەبێت ئەگەر بڵاویش دەکرێتەوە یان لەبەر چاوی خەڵکی دەکرێ ناوو زاراوەی (أفشاء)ی لێنراوە، ئەو دۆخە زیاتر بۆ میللەتێك ترسناك ترە کە خەریکی خۆ دروست کردنەوە بێ، یان لە قۆناغی رزگاریدا بێ وەك میللەتی کورد، ئەوەیان کەمتر هەستی پێ‌کراوە نەك لەلایەن عەوامی خەڵك هەتا لەلایەن سەرکردایەتی‌و توێژەرەوەکانیش، تا ئێستاش راگەیاندنی کوردی نەیتوانیوە ئەو بینا کۆمەڵایەتی یەی (داگیرکەرانی تێکیان روخاندووە بە مەبەستی کوشتنی گیانی بەرگری) دروستی بکاتەوە، هەڵبەتە ئەوەیان وەك یاسایەکی گشتی بۆ هەموو وڵاتانی ئیسلامی‌و هەتا لە کات‌و ساتی خۆی بۆ هەمو جیهانیش پێویستە، ئەوەیان بەپێی پێوانە ئەخلاقی‌و پرانسیپەکانی بینای کۆمەڵایەتی، خۆ لایەن‌و مەدرەسەی واش هەیە ژیان‌و بەردەوامیەکەی وەستاوە لەسەر تێك روخاوی مرۆڤ‌و کۆمەڵگە هەروەك زۆرێك لە پۆلەکانی زیندەوەران ژیانیان لەسەر ناخاوێنیە، ئەو لایەن‌و مەدرەسانە لە کۆمەڵگەیەکی بە ئەمرازوو، مەبادینی، دادگەری، هەستیارو وشیار، ستاندەر، .. ناتوانێ بخوا، هەڵخەڵەتێنێ، راست چەوت بکاو چەوتیش راست بکا، ...هتد.

کۆمەڵگەی کوردستانی ئێستا لە هەموو کاتی زیاتر پێویستی بە

ڕاگەیاندنێکی (هادف)و بیناکەر هەیە، چونکە نەك هەر باری کۆمەڵایەتیو نیشتمانیو سیاسی.. تێکڕووخاوە باری دەروونیشی تەنك بووە کە دوا سەنگەری بەرگری باری شەخسیو سایکۆلۆجیە، با سەرنج بدەین لەناو کۆمەڵگەی خۆمان ئەو دەردە دەرونیانە خەریکە باو وەرگرێ، دەردەکانی (تەقەزوم، امتصاص ثقافي، صدمة الثقافية، انصهار ثقافي، غزو الثقافي، گومان، چەند ڕوویی، خودویستی، پەرتەوازەیی، چاولێکەری، بەدواکەوتن، مەزەندەی خراپی..)، لێرەوە سەرانی بەرژەوەندی پەرست ژیانو سەرمایەکەیان بیناکراوە لەسەر ئەو تێك ڕوخاویو چەواشەیەی خەڵکی هەروەك لە کۆنەوەش ژیانی پادشاو ئیمپراتۆرو دەستو پێوەندیان لەسەر ئەو فریودانو دەردو چەواشەکاریە بووە، لە هەموو جۆرە ڕاستیەك ترساون، ئێستاش ئەوانەو دەسەڵاتخوازو دیکتاتۆریەکانیش بەگشتی بە ئەندازەی موشەك لە ڕاگەیاندنی (هادف) دەترسن، لە بیناکردنەوەی مرۆڤو کۆمەڵ دەترسن، لە وشیاریو زانیاری خەڵکی ترساون.. بۆیەش دەبینین لەو عمولەمە سیاسیە هەر شەرعیەتو بڕەو بە فاکتەرە شاقوولیە کۆمەڵایەتیو کلاسیکیەکان دەدەن، ئەو نوێگەراییەش بەو نەساغیەی هەر مەرگە.. بۆیە ڕاگەیاندنی (هادف) ئەرکی زۆر گرنگو ئاڵۆزە.. بەداخەوە لە کوردستانو وڵاتانی عەرەبی بەگشتی ڕاگەیاندنی عەلمانی لەو بوارە نەیپێکاوە، لەپێش ڕاپەڕین ڕاگەیاندنی کوردی زۆر کاریگەر بوو بە سانسۆرێکی چەپی کەچی لەدوای دارمانی مەدرەسەی چەپو شیوعیەت ئەوجارە بەو ١٨٠پلە پێچەوانەو تەواو بەرەڵاکراوە، ڕاگەیاندنێك کات بەرێ دەکا بێ ئامانج مەگەر تێکیش نەدا، ئەوەیان بەوردی لە پشکنینێکی سەرەتای ڕاپۆرتی سیاسی کۆنگرەی حزبە کوردستانیەکان دەردەکەوێ کە هیچ وەسیەتێکی تیا نیە بەو مەبەستە[1]، نمونەیەك تۆمار دەکەین کەوا دەردەکەوێ زۆر دوورە لەو بابەتە کەچی چەندە کاریگەرو نزیکەو ڕاگەیاندنی کوردی سازی داوە سەرنج بدە: لەو ماوەیە چەند وتارو نووسینێك لەبارەی ژیانی

---

[1] سەرنج بدە هەریەکە لە ڕاپۆرتی سیاسی (پدك)و (ینك) بۆ نمونە.

(مەلا مستەفا بارزانی) نووسرا، گوایە پیاوێکی زیاد دنیایی بووەو مەشروبی خواردووەو...هتد[1]. سەیرتر لەوە لە وەڵامدا دەزگای راگەیاندنی گوڵانی (پ دك) گوایە بەرپەرچی ئەو جۆرە نووسینانە دەداتەوەو دەنووسێ: ((باشە کام سەرکردەی کورد هەیە مەشروبی نەخواردبێتەوە[2]))! ئنجا هەر دوابەدوای ئەمەش نازناوی (مەلا)شی لێ ستاندرایەوە.. هەموو ئەوانە راگەیاندنو گوتارێکی لیبرالی روخێنەرە لەبەر هۆیەکی سادە: جارێ ئەو زانیاریانە راست نین، ئنجا مەلا مستەفا پیرۆزی لەناو میللەتی هەیە، وا بەناوبانگە کە خۆنەویستو ئایین پەروەرو سەودانەکەرو بێسامانو دادپەروەر بووە، بۆیە لە ٩٥٪ی خەڵك ویستویەتی، کەچی ئێستا هیچ سەرکردەیەك لە ٥٠٪ی دەنگ نیە، خۆ ئەگەر ئەو زانیاریە راستیشی بوایە ئەوا ئەگەر رەچاوی (راگەیاندنی هادف) بکرێتو لە خەم بینای کۆمەڵایەتی کورد بوونایە نابوایە بڵاوی بکەنەوە (إفشاء نەکرێ) وەك شێخەکە، چونکە ئەو میللەتە زیاتر متمانەی دادەرمێ بە سەرکردەکانیان هەردەم خۆ بە هەڵخەڵەتاوو فێڵ لێکراو نەزانن کە زۆر کاریگەرە لەسەر سایکۆلۆجیەتی تاكو دەردەکانی بەزیوی (گومان، بێمتمانەیی،گوایە : راستی نەماوە، هەرکەسە بۆ خۆیەتی، ...)، چونکە ئەو کەسێتیانە هێمای مێژووین بەڵکو بەشێکن لە (ئاسایشی نەتەوەیی)و پاڵپشتە کۆمەڵایەتیەکان بۆ نمونەی کۆمەڵایەتیو سەرکردەی خۆنەویستی نوێ کە ئێمە قەیرانی کەمیمان لێ هەیە.

---

[1] هەر یەکە لە کتێبەکانی (جرجیس فتح الله)و (نەوشیروان مستەفا) هاتووە.
[2] بڕوانە کتێبی (پشکۆ نجم الدین) کە لە گوڵان دەرچوو.

(٤٠)

# نەتەوایەتی القومية Nationalism

زۆر جۆرە پێناسی هەیە، هەریەکە بەپێی مەدرەسەو رۆڵەکانی لە واقیعو لە مێژوو و لە ئایندەشدا پێناسی خۆی هەیە، لە هەموویان باوتر کە لە لایەن نەتەوە گەریەکانی ئێستا پەیرەو دەکرێ ئەوەیە: (کۆمەڵە خەڵکێکی خەملیو لە نەتەوەیەك دا بەهۆی پرۆسەیەکی مێژوویی تیایدا زمانو مێژوو و کەلتوورو دەروونو خاکێکی هاوبەشیان بۆ دروست بووە)[1].

هەڵبەتە نەتەوەو نەتەوایەتی لێك جیان، نەتەوە ئینتمایەکی کۆمەڵایەتیە، بەلاّم نەتەوایەتی دەبێتە ئینتمایەکی کۆمەڵایەتی و سیاسی، هەروەك لە پێناسەکان دەردەکەوێ، لە فەرهەنگێکی وەك (موسوعة العالمية هەڵێنجراوی (دائیرەی معارفی بەریتانیا- G.E british)یە،) کە زۆر دەمارگیری نەتەوەییش نیە دەڵێ: (تعبير سياسي يعني شعور الناس جميعا بالإنتماء الى أمة واحدة).

لە هەندێ دۆخ جۆرێك لە رەوای وەردەگرێ، ئەگینا بە سیاسی کردنی ئینتما کۆمەڵایەتیەکان سەرچاوەی ستەم و نادادگەریە، لە (پێش ئیسلام) (نەتەوە-قوم) (بە بنەماڵەو تایفەك وتراوە تەنها بە پیاوەکانیان بێ ئافرەت)[2] یاخود بە کۆمەڵە خەڵکێك وتراوە کە بۆ ئیشێکی دیاریکراو هەڵدەستن[3]، بەلاّم لەسەردەمی ئیسلام

---

١ موسوعة السياسة – ع.غ.ف.ق، ج٤ ل٨٣٠.

٢ معجم الكنوز الامثال والحكمة العربي ، ل٣١، هەروەها مختار الصحاح-الرازي، مادە: القوم.

٣ بروانە: لسان العرب، معجم الألفاظ القرآن،...

(نەتەوە-قوم) بەو کۆمەڵە خەڵکە (ژنو پیاوە) وتراوە کە هەڵساونو ئامادەن بۆ کارێك هەروەك (مفردات الفاظ القرأن )ی راغب و (لسان العرب )و (قاموس المحيط ).. (د.ترابی)یش هەروا دەڵێ: (.. والقوم كلمة في القرآن تشير الى من قاموا معا على شأن مشترك)[1]، لە قورئانیش کە باسی (یاقوم) کردووە مەبەستی نەتەوە نیە، (القوم: في الاصل مصدر قام يقوم فوصف به اى جعل وصفا شاملا للذكور‌ء الاناث لتحقيق القيام بهما، ثم غلب على الرجال خاصة لقيامهم بأمور النساء..)[2]، لە کوردیش وا پێدەچێ نەتەوە لە (نەوەی-تە)ی بادینی هاتبێت کە جاران کەفەرهەنگی ئەوان زاڵتر بوو بەسەر سۆرانی، ئیتر گەشەی ئەو زاراوە لە نەتەوەوە بۆ نەتەوایەتی (کە لە دوایی زیاتر باسی دەکەین) لە ئەنجامی (غیابی ئاینی راستەقینە)و گەشەی کۆمەڵە.. ئەوا بەشێك زیادە رەوی لێ دەکەنو دەیکەنە (مەبادیئی ئەمر) وەك (أمة عربية واحدة-ذات رسالة خالدة)، یان وەك لە کۆنگرەی بنیاتنانی حزبی بەعس ١٩٤٧ لە هەردوو مادەی (٣)و (٤) هاتووە: (أنه حزب قومي يؤمن بأن القومية حقيقة خالدة..) لە فەرهەنگی حزبی بەعس دەڵێ: (قومية ليست مرحلة تاريخية..)[3]، فاکتەری بەهێزتر بەکار دەهێنن بۆ دارشتنی بناغەیەکی (تەزویر) بۆی کە نیەتی، بۆ نمونە بەشێکی زۆر لە نەتەوەگەریەکان ئاینو مێژووو خاكو زمانو باری دەروونیو بەرژەوەندیو چارەنوسی هاوبەش دەکەنە بنچینەو فاکتەرەکانی پێکهاتنی نەتەوایەتی، جاریش وایە دەیگەیەننە رێزی نوێمە.

هەڵبەتە مرۆڤ زۆر جۆرە ئینتمای جیاجیای شاقوڵیو ئاسۆیی، وەرگیراوو میراتی، .. هەیە، هەندێك لەو ئینتمایانە نوستونو هەتا نەوروژێن دەرناکەون،

---

[1] المصطلحات السياسية في الاسلام. د.حسن ترابي.
[2] موسوعة المصطلحات جامع العلوم.
[3] تعريفات ببعض المصطلحات مادة: القومية

لەوانە ئینتمای نەتەوایەتی یـە، کـە ئینتمایـەکی سروشـتیە، لـە ریـزی زنجیرە ئینتمایـەکانی شـاقولی وەك: خێـزان، بنەماڵـە، تـیرە، خێـڵ، نەتـەوە..، بـە پێچەوانەی زۆربەی بۆ چوونە نەتەوەگەریەکان کە نەتەوە بە ئینتمایـەکی تایبـەت تر لەوانە حسێب دەکەن، سەرنج بدە ئەو تەقەلایەی (د.کیالی) داویەتیو دەڵێـت: (پەیدابوونی نەتەوایەتی سیاسی بۆ ئەومیە ئـەو دابەشـیە شـاقوولیەی خێڵـەکیو تائیفیو نەژادیو تیرەیی نەهێڵێ)[١]، نەخێر، ئەوەش هەر شـاقوولیە، هـەمو ئـەو جۆرە ئینتمایانە بەدمرە لە خواسـتی مـرۆڤ، میراتیـە، خوێنـە، بایۆلۆجیایـە، .. جەوهەری مرۆڤی پێ دیاری ناکرێت لە چاکەو خراپەو رەوشتو تەبیعات و.. ئـەو ئینتمایەش (بەنەتەواتیشەوە) (نەمر)و (ئەزەلی) نەبووەو نیـە، هـەروەك زۆربـەی نەتەوەگەریەکان وای بۆ چووینە، بەڵکو لە قۆناغێکی درەنگـی مێژوویـەوە ئـەو دیاردە مێژوویـانە زیاتر بەپێ ی پێویستو فاکتەری بابـەتی (لـە غیـابی ئـاینی راستەقینە) دروست دەبێت، جاران مرۆڤ تەنها پێویستی بەبوونی لە بنەماڵەیـەك بـووە مـادام بازنەیـەکی بـچووکی جـوگرافی مـەودای چـالاکیەکانی ئـابووریو کۆمەڵایەتی بووە، پاش گەشەکردنو فراوان بوونی ئەو بازنە، ئنجـا پێویـست بـە تیرەو هۆزیش بووە، لە دوای گەشەیەکی هەمەلایەنی کۆمەڵ -کەبریتیـە لـە پـێ نان لە قۆناغی عەولەمە- بەرەبەرە مرۆڤ پێویستی بەبوون لەنەتەوەیەك بـوو وەك ناسنامەش، جاران لە وەڵامی ئەو پرسیارە تۆ کێی؟ دەی وت مـن فلانـە هـۆزم، بەڵام ئەو پرسیارە ئێستا لە ژێر رۆشنایی بە جیهانی بوونا دەڵێ فلانـە نەتـەوەم، ئیتر پرسیاری وا لە (عەولەمە)ی تەواو رەنگە جۆرە وەڵامێکی تر بخوازێ..

پرۆسەی پەرینەوەی ئینتمای مرۆڤ لە خێڵـەوە بـەرەو نەتـەوە وەچـەرخانێکی سادە نەبووە، کۆمەڵێك گۆڕانکـاری ریـشەیی لەسـەرخانو ژێرخـانی کۆمـەڵیش لەگەڵ خۆی راپێچ کردووە، بەکورتی شتێکی لـێ باس دەکەین:

[١] موسوع السياسة.ع.غ.ف.ق، ج٤ ل١٨٠.

**لە سیاسیەوە:**

- لە سیستەمی ئیمپراتۆریەتەوە وەرچەرخاوە بۆ دەوڵەتی نەتەوەیی.
- لە پادشاییەوە[1] بۆ کۆماریەوە.
- لە سیوکراتیەوە بۆ دیموکراسیو دەزگاییو مەدەنیەتەوە.
- لە دیکتاتۆری تاکی بۆ دیکتاتۆری مونەسسەساتیشەوە.
- لە پەیوەندی خێڵەکی بۆ پەیوەندی فکریو (حزبی)یشەوە.

**لە ئابووری:**

- لە کشتو کاڵەوە وەرچەرخاوە بۆ پیشەسازیش.
- لە بەخێوکردن بۆ جێنشینیشەوە.
- لە قورسایی لادێ بۆ قورسایی شار.

**لە کۆمەڵایەتی:**

-لە ناسنامەی خێلەکیەوە بۆ نەتەوەیشەوە.
-لە دەرەبەگیەوە بۆ بەرجوازیەتیشەوە.
-لە جووتیاری بۆ کرێکاریشەوە.

**لە ڕەووشتی:**

- لە مەبادیئەوە بۆ بەرژەوەندی.
- لە بەرژەوەندیشەوە بۆ بەرژەوەندی تایبەتی تر.
- لە سیاسەتی مەبادیئی بۆ سیاسەتی میکاڤیلیشەوە.

**لە فکری:**

- لە ئاینی کلاسیکی بۆ عەلمانی.
- لە میسالی بۆ مادیشەوە.
- لە کاریگەری کۆمەڵایەتی بۆ کاریگەری ئایدیۆلۆجیش.

---

[1] هەڵبەتە مانای وانیە ئەو وەرچەرخانە ئەوەی پیشووی خۆی فت (نەفی) کردبێ، واتە لە کشتوکاڵیەوە وەرچەرخاویشە بۆ پیشەسازی وکشتوکاڵیش هەر ماوە، .. پادشایی هەرماوە..

- لە ئینتمای کۆمەڵایەتی بۆ ئینتمای سیاسیشەوە.

**لە ئەحوالی تاکەوە:**

- لە ئینتمای خێڵەکیەوە بۆ ئینتمای نەتەوەیشەوە.
- لە پێکەوەیی زیاتر بۆ بەتەنهایی.
- لە توانەوەی فاکتەرە کۆمەڵایەتیەکان بۆ فاکتەرە ئایدیۆلۆژیەکان.

لەگەڵ کۆمەڵێك گۆڕانکاری تر...٠

بەو شێوە گۆڕانی نەتەوەش بەرەو (عەولەمە) کە ئەوەیان لە راستیدا کۆتایی پێ هێنانی ئینتماو وەلای شاقوڵیەکانە بۆ ئینتمای ئاسۆیی کە ئەویش کۆمەڵێك گۆڕانکاری قووڵ لەسەرخانو ژێرخانەوە لەگەڵ خۆی رادەپێچێ.. لەهەمووی گرنگ تر ئەوەیە پانتایی( ئینتمای موکتەسەب- وەلا) جووت نامێنی لەگەل پانتایی (ئینتیمای میراتی)، بەڵکو (وەلا) لە ئینتما جیا دەبتەوە بە یەکجاری (زیاتر لە عەولەمە باسی دەکەین)، لێرەوە مانای چەوتی (نەتەوایەتی نەمر-خالد) دەردەکەوێ کە قۆناغێکە رەت دەبێ، ئیتر جیهانیش بەرەو دابەشیە لەسەر بنچینەی شارستانی وفەرهەنگیو ئایدیۆلۆجیو مەدرەسەییو لە کۆتاییدا بەرەو ئاینی دەبا، بۆیە هەم لە کۆنگرەی هەزارەو هەم زانایانیش ئاماژە بەوە دەکەن کە ئەو سەدەیەو قۆناغی عەولەمە دیسان گەڕانەوەو بەرەو ئاین چوونە.

بەو شێوەیە پەرینەوەی مرۆڤ بۆ نەتەواتیش ئاسۆو سەردەمێکی نوێی لە واقیعی کۆمەڵ هێنا ئاراوە، بەتایبەتی لە بواری سیاسیو دەستووریەوە، سەرنج بدە گۆڕانی پادشایی لە میسر بۆ کۆماری لە ساڵی ١٩٥٢ بەدواوە، بووە هۆی بە دەستووری کردنی بیرو ئینتمای نەتەوایەتی، هەروەك لە دەستووری ١٩٥٦ لە مادەی ١٩٢ نووسرا: (یكون مواطنون اتحادا قومیا للعمل علی تحقیق الاهداف التي قامت من اجلها الثورة).. ئاواش لە عێراقو ولاتانی تر ئیتر نەتەوایەتی کرا مەبادیئو تەرازووی سیاسی وهەتا ئەخلاقیش، لە زۆر کتێب باس لە (ئەخلاقی نەتەوەیی)یش کراوە هەروەك کتێبەکەی (ئەرنست بارکەر)، لەناو عەرەبو تورکو

نەتەوەی تریش نمونەی لێ پەیدا بوو، جۆرە رەوشتێکی چاكو شارستانیو کەلتووری باڵآو هەتا ئاینیشیان تایبەت بە نەتەوە کرد هەروەك لە (الكتاب الاخضر) وەك چارەسەرێك دەڵێت: (القاعدة السليمة هو ان لكل قوم دين)[١].

ئەوەی نوێ هاتە سەرنەو قۆناغە وشیاری ڕابوونو هەستی نەتەوەیی یە، کاتێ بینرا خەڵکی نەتەوەی هەیەو لەسەری یەکدەگرنو دەوڵەت دروست دەکەن..

لە (غیابی ئاینی راستەقینە) جۆرێك لە رەوایی وەردەگرێ، جەوهەرو ناوەرۆکی ئەو زاراوە لە ئەوروپا سەری هەڵدا نە ئیسلامو نە مارکسیەتیش بەشداریان لە دروست کردنی نیە، هەمو مێژوو فەرهەنگە ئیسلامیەکان بێشکنی هەر زاراوەی (قومیة)شی تیدانیە بەو ماناسەی ئێستا، لە هەموو کەلتوورو فەرهەنگی ئەمەوی، عەباسی، ئەیوبی، عوسمانلی، .. بابەتێك نادۆزیەوە بەناوی (قومیة) یان (عروبة) یان تورکایەتی یان کوردایەتی، هەتا لەسەردەمی عوسمانیش دەزگاکانی رەگەزنامە بەناوی نەتەوە تۆمار نەکراوە، بەناوی ئاینی بووە، ئەگەر بەووردی (معجم الكنوز الامثال الحكمة العربية) یان (معجم الالقاب أرباب السلطان في دولة الاسلامية) هیچی نیشانەی نەتەوەیی تیادا نیە، ئەو نازناوانە هەبووە: (أسد الدولة، الاشراف، الاعز، الاغا، الافضل، أفندي، أقبال الدولة، امين الدولة، تاج الملوك، الخواجة، شاهنشاه، صاحب الجلالة، الغازي، القائم بحق الله، القاهر، المستنصر بالله، المظفر، ملك الاشراف، ملك العادل، المهدي بالله، الناصر..هتد)، هەتا سەدەی بیستەمو بەرەبەرە لەگەڵ کشانەوەی ئیسلام لە گۆڕەپان ئەو جۆرە بیرانە هاتنە پێشو ناوی وەك: قائد العربي، ئەتا-تورك، بطل التحرير القومي، .. ناوی تری تورکیو عەرەبیو فارسیو.. هاتە پێش، لەسەردەمی ئەمەویەکان توندرەوی لە دەسەڵاتیاندا، بەشێك شێوازی ڕگەز پەرستی وەرگرتبو، ئەوەی لەخانەدانە عەرەبەکان (قورەیش)

---

[١] معمر القذافي - كتاب الاخضر

نەبوایە بە (موالی ) ناوزەدیان دەکرد، دوای بە (شعوبی) ئەوانەش ئەو زانایانە بوینە کە عەرەبی بە سەر عەجەم (فضل) نەکردووە.

ئەتەوە لە ئیسلامدا تەنیا زمانەو بەس نەك (مێژوو، خاك، باری دەروونی، چارونووسی هاوبەش، حوکم، دەوڵەت، بەرژەوەندی هاوبەش، ..)، ئەوانە هەموو بە (عصبية) لەقەڵەم دراوە و(حرام) کراوە.. هەروەك لە فەرموودەش هاتووە (أيها الناس ان الرب رب واحد، والاب أب واحد، الدين دين واحد، ان العرب ليست لاحدكم بأب ولا أم، إنما هي لسان، فمن تكلم العربية فهو عربي)، لە قورئانی پیرۆزیش: ﴿يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ ذَكَرٍ وَأُنْثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوبًا وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾.. بۆ رەت کردنەوەی هەمو ئەو فاکتەرانەی کاریگەر لەسەر مرۆڤ دەفەرموێ: ﴿قُلْ إِنْ كَانَ آبَاؤُكُمْ وَأَبْنَاؤُكُمْ وَإِخْوَانُكُمْ وَأَزْوَاجُكُمْ وَعَشِيرَتُكُمْ وَأَمْوَالٌ اقْتَرَفْتُمُوهَا وَتِجَارَةٌ تَخْشَوْنَ كَسَادَهَا وَمَسَاكِنُ تَرْضَوْنَهَا أَحَبَّ إِلَيْكُمْ مِنَ اللَّهِ وَرَسُولِهِ وَجِهَادٍ فِي سَبِيلِهِ فَتَرَبَّصُوا حَتَّى يَأْتِيَ اللَّهُ بِأَمْرِهِ وَاللَّهُ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الْفَاسِقِينَ﴾.

لە مارکسیەتیش نەتەوایەتی بەروویەکی تری بەرجوازیەت لەقەڵەم دراوە، بۆیە لە مانفێستەکەی مارکس و ئەنجلس دەڵێ: (کرێکاران نیشتمانیان نیە)[1]

## بنەچەو گەشەکردنی:

بەپێی هەموو پسپۆرو فەرهەنگەکانی ئەو بەشە لە سەدەکانی (١٨-١٩) لە نوسینەکان هیگل و نیتچە پێش تریش رۆسۆو شۆرشی فەرەنسی، بانگی سەربەخۆییەکانی ئەوروپی بەتایبەتی یۆنان و سربیا لە عوسمانی کراوە، بزوتنەوەکانی تری کە لە فکر بەرەو واقع بەرێکەوت وەك: لە ئەڵمانیا (لەهیگلەوە بۆ بسمارك تا نازیەکان)، فەرەنسا ش:لە رۆسۆ بۆ ناپلیۆن وشۆڤینیەت، ئینگلترا: (گلیدستۆن تا ئیمپریالیزمی)، ئیتالیاش: (گاریبادلی-مزینی تا فاشیەکان)..،

[1] بيان للشيوعي-ماركس-أنجلس.

بەو شێوەیە ئیسپانیاو جیهانی تری گرتەوە. نەتەوایەتی سێ دۆخ وەبەستی سەرەکی هەبووە، یەکەم ڕزگاری لە ژێر دەستی داگیرکەران، دووەم یەکگرتنەوەی پارچە پارچەیی نیشتمانێك، سێیەم داگیرکاری ...

یەکەم جار لە کۆتایی سەدەی (١٨) لە ئەڵمانیا وەك بزوتنەوەیەکی ڕۆمانسی لەلایەن نووسەرو سیاسەتمەدارو هونەرمەندەکانی سەری هەڵدا لەکاردانەوەی شکستەکانی[١]، (بسمارك)یش یەکەم پەیڕەوکەری بووە لە جەنگی ١٨٧٠زو یەك خستنەوەو دروست کردنی ئەلمانیا لە١٨٧١، هەرچەندە لەسەر ئەو سەرەتایە کۆك نین هەندێکی تر شۆڕشی فەرەنسیو جارەکەی مافی چارەی خۆنووسی گەلانی پێ سەرەتا بووە کە ئیمپراتۆرەکان بەرەو دەوڵەتی نەتەوەیی پێ وەچەرخا، بەشێکی تر (پەیمان نامەو ڕووداوی ویستیفالیا (WEST PHALIA)-١٦٤٨[٢] بەو سەرەتایە لەقەلەم داوە، بەشێکی تر هەڵمەتەکانی ناپلیۆن بۆسەر هەندێ میللەتی ڕەسەنو کاردانەوەیان دەکەنە سەرەتا، هەشە جارنامە (١٤) خاڵیەکەی مافی میللەتانی (ویلسۆن)ی سەرۆکی ئەمریکی کە لە سالی ١٩١٨ دەرچوو دەکەنە ئەو سەرەتایە، دوای مافی میللەتان لە ( عصبة الامم - کۆمەڵەی نەتەوەیی لە مادە (١) فەقەرە -٣-)و تا دەگاتە چەپیەکان کە سەرەتای ئەو مێژووە بۆ شۆڕشی ئۆکتۆبەری ١٩١٧، جارنامەی (لینین) بۆمافی میللەتان کە بووە هۆی سەربەخۆیی فنلنداو پۆلەندا، ئنجا پەیدابوونی بزوتنەوەی رزگاری نەتەوەیی، تا ئەو ڕایەش کە لە هەردوو جەنگی جیهانی هەر لایەی نەتەوە بچووکەکانی ناو لای دوژمنی هان دەدا بۆ رزگاریو شەڕو کێشە..

بەداخەوە بەشی زۆری نووسەرانی جیهانی سێ یەمیش وەك ڕۆژئاوا بڕیارو هەڵوێستەکانی خەلافەتیان فەرامۆش کردووە، سەرەڕای ئەو سەلبیاتو کارە دڵتەزێنانە.. کەچی لەگەڵ سەرهەڵدانی کێشەی نەتەوەیی، لە کۆتایی سەدەی

---

[١] موسوع السياسة.ع.غ.ف.ق، ب٤ ل٨٣١.
[٢] بڕوانە (عەلمانیات) هەر لەو فەرهەنگە.

(١٩)و سەرەتای سەدەی (٢٠) خەلافەتی عوسمانی زۆر بڕیاری گرنگی دا سەبارەت بەسەربەخۆیی نەتەوەکانی عەرەبو کوردو چەرکەس و..لە هەموان لە پێش تر جارنامەی (جامعة الاسلامية )کە تیایدا هەر میللەتەو مافی دەوڵەتی پێ درابووکە ببنەوە ئەندام لەو جامیعەیە،کوردیش لە ڕێی شێخ سعید نورەسی ئەندامێکی چالاکی ڕیزی پێشەوە بوو، بەڵام سەرکەوتنی تەیاری عەلمانی کەمالی بەسەر خەلافەت بەشێك لە بڕیارەکانی لەباربرد، ئەوەی پێی ڕاگەیشتن بڕیارەکانیان ڕاگرت، ئینجا لە پێشتریش بە حوکمی سیستەمی (ویلایات)و شوڕاییانە کەمتر نەتەوەکان ئەو کێشەیان هەبووە (لە مەسەلەی کورد زیاتر باسی دەکەین).

ڕەنگە هەموو ئەوڕووداوانە دەوری خۆی هەبووبێ بۆسەرهەلدانی نەتەوەیی نەك تەنها یەکیان، بەهەر حاڵ لە کۆتایی سەدەی (٢٠) نەتەوایەتی بەفراوانی لە ئەورووپاشەوە پەڕیەوە بۆ جیهانی ئیسلام، بەپێی هەندێ سەرچاوە (ناپلیۆن) بە یەکەم گەیەنەری ئەو بیرە دانراوە، لەناو جەرگەی عوسمانیش حزبی ئیتحادو الترقی لە ١٨٨٩ دروست بوو، لەناو عەرەبیش بەدەیان سەنتەرو ناوەند دروست بوو بۆ ئەو مەبەستە، هەر بەو شێوەیەش لەناو کوردانیش وەك فکرەیەك تەنها لەناو ڕەوشەنبیران هەبوو، تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم ئینجا بووە خواستێکی میللی، کەواتە مێژووی سیاسی نەتەوەیی بەهەموو پێوانەیەك لەدوو سەدە تێ ناپەڕێ لە جیهان، بۆیە دەبینین هەرناوەی نەتەوەیەکیش لە بۆنەو ناوێك هاتووە، ئەسڵی ئەرمەنی گوایە لە خواوەندێکی جەنگی Armenius هاتووە[1]، ئەسڵی (فارس) (پارس) بوو، کە جاران بەزاراوەی شایەکانیان وتراوە زاراوەی پارسی[2]، لە فەرهەنگە کۆنەکانی عەرەبی لە (کشاف)یش ئەو ئەسڵەی تیانیە، بەڵام بەخەڵکی ئەفامە ڕەوەندە عەوامەکان وتراوە (عەرەب)[3]، (إبن أزرق) لەکتێبی (بدائع

---

[1] معجم الدیانات؛ أساطیر العالم، امام عبدالفتاح امام، ل١١١

[2] بۆزیاتر بڕوانە (فەرهەنگ فارسی عمید) ب١ (ا-ح) ل٤٩٥.

[3] المنجد في اللغة و الاعلام ل٤٩٥.

السلك في طبائع الملك) و (إبن خلدون)یش لە (مقدمة) بەراشکاوە تر باسی (عەرەبی) کردووە بە دڕندەو دژ بەشارستانی وەسف کردوە ئەگەر لە ئیسلام دابڕنرێ.

بە پێی هەندێ سەرچاوە تورکیش ناوێکی عەوامانەو هاوتای (بێ ئیدراك)یە[1]، ڕەنگە ناوی کوردیش بە خێڵەکیە تۆخەکانی دوور لە شارستانی ووترا بێ.

ناوی زۆربەی ئەو دەوڵەتە ئەتەومییانە بە سنورەکەشیانەوە هەر بەو شێوەیە هاتووە، واتە نیشتمانێکی دەستکردە، عێراق بەو پارچە زەویە ڕەشەی سەرووی بەسرەی وتراوە عێراق و ناوێکی فارسیشە لە ئەراك هاتووە[2]، لبنان شاخێکە ناوی (جبل لبنان) بووە، ئوردەن ڕووباری ئوردەن، کۆنگۆش بەناوی ڕوبارەکەی هاتووە... هەمو ئەو ناوانە نوێن بەبۆنەی جیاجیا ناویان لێ نراوە (جگە لە هەندێکیان) کە ناوی جوگرافیان هەبوە نەك سیاسی، چەند نمونەیەکیان لێ هەڵدەبژێرین:

**ئەریتریا:** لە ئەسڵدا ئەریتیریۆمە واتە دەریای سوور بەزمانی یۆنانی، بەو قوڕە سوورەی لە دەریاکە هەیەو سور دەردەکەوێ.

+**عێراق:** أرض السواد، بلاد بابل، بلاد اشور، میزۆپۆتامیا، بلاد مابین النهرین ...لەگەڵ زۆر ناوی تری هەڵگرتووە،زیاتر بەو پارچە زەویە ڕەشەی سەروو بەسرا وترا عێراق[3] لە ئەخشەی ئیبن ئەحۆقل ئەخشەکەی لە بەیەك گەیشتنی هەردوو ڕووبار لەقورنە دیاری کردووە لە ٥٠کم' تێ ناپەڕێ، (عیراقان) بە کوفەو بەسەر وتراوە، یان جاروایە کووفە بە (عراق العجم) ناوبراوەو سەرووی (بصرە) بە عراق العرب، هەرگیز کوردستان بەشێك نەبووە لە عێراق.. هەتا لە ئەخشەی

---

١ محاضرات في نشوء القومية، ساطع الحصري، هەروەها بڕوانە دراسات في حركة الكردية المعاصرة – د. عثمان علي.

٢ بروانە ئەخشەی ئیبن ئەحۆقل

٣ أطلس الحضارة الاسلامية.

ئیسلامی کۆن ناوی کوردستانی تیادایە ناوی عێراقی تیادانیە، عێراق بەو خاکە سوێرەش وترا کە ئەڕوێ[1] (سەرنج بدە: موسوعة التاریخ الاسلامي، ج٧ ل٦٢).

**لبنان:** شاخێك بوو بەناوی جبل لبنان.

ئوردەن: بەو دۆڵە وتراوە (وادی الاردن) کە ڕووبارەکەی تیادایە.

**ئەسیوبیا:** بەیۆنانی مانای وڵاتی دەمو چاو سوتاو (لەبەر ڕەشی) ئەوەیان وەك لە نووسینەکانی هیرۆدۆتس، ستراپۆ، ئینجیل، .. دەردەکەوێ بەهەمو ئەفریقیان وا وتوە.. ناوێکی ڕەگەز پەرستیە بۆیە لە ئیسلام هەر بەحەبەشە ناوبراوە.

**ناوی ئەمریکا:** بە (جیهانی نوێ-عالم جدید) ناو دەبرا، دوای لەساڵی ١٥٠٧ز (جمعیة العلماء المختصین) لە (سان دیبە)ی فرنسی ناویان نا ئەمریکا بە ناوی (ئەمریکۆ فیسبۆتکی) کە چوار جار چووبووە ئەمریکا لە ساڵی (١٤٥٤ز-١٥١٢ز).

+ **بریتانیاش** جاران ناوی خوایەکیان بوو دوای بووە تاجی شاهنشاهی.

+ **ئوسترالیا:** بەمانای لاتینی (خوارووـجنوب) .

+ **جزائر:** جاران ناوی بلاد بربر بوو دوایش (مغرب الاوسط)، دوای ئەوەی عوسمانیەکان شارێکیان لەسەر دەریا دروست کرد بەناوی (جزائر) ئیدی وڵاتەکەش بووە ئەو ناوە.

+ **سری لانکا:** جاران ئەو ناوچە بە سیلان ناوی ڕۆیشتبوو چونکە گوایە ئادەم لەو نزیکان هاتتە خوار لە دوای سزاکەی، لە ساڵی ١٩٧٢ ناوی نراسری لانکا بەمانای زەوی درەوشاوە، چونکە دەدرەوشاوە بەشەو.

+ **مۆریتانیا:** ئەو ناوە لە (مۆر) هاتووە کە ناوێکی ڕۆمانیو ئیسپانیە بە موسوڵمانانیان دەووت بە زمانی ڕۆمانی مانای (ڕەشتاڵە)، لەهەرجێیەك ئیسپانی پێ گەیشتبێ ئەو ناوە لێ هەیە وەك لە خوارووی فیلیپینیش بە موسڵمانەکان دەووترێ مۆرۆ..، لە سەرەتا بە سوپای (طارق کوڕی زیاد) کە خەڵکی سەرووی

---

[1] المنجد: ل٥٠١.

ڕۆژئاوای ئەفریقیا بوون وترا (مۆر)، بەڵام سەنیگالیەکان بەو ناوچەیەی ئێستای مۆریتانیان دەووت (ڤۆتی) دوای بووە (مۆریتانیا).

+ **ئەرجەنتین:** لە (ئەرجەنتیۆم) لاتینی هاتووە مانای خاکی زیوی (لەبەر ڕەنگی زەویەکەیان)[1]..

تەنانەت پاکستان کە دەوڵەتی دروست کرد هیچ ناوێکی پڕ بەپێستی نەبوو، کە جاران بە (دۆڵی سند) ناودەبرا، هەڵسا هەرپیتەی ڕەگەزێکی وەرگرت‌و (پاك)[2]ی لێ دروست کرد.. ناوی نەتەوەیی نەبووە، هەر لەبەر هەمان هۆی نەبوونی فاکتەری نەتەوایەتی‌و سستی ئەو هەستە دەبینین کورد حوکمی فارس‌و عەرەب‌و تورکی کردووە (ئەردەشێر، کریم خانی زەند، ..) لەسەر فارس‌و (صلاح الدین) لەسەر هەموو..، قاچاری تورك بوو حوکمی ئیمپراتۆریەتی فارسی کردووە، عەرەبێك حوکمی ڕۆمی کردووە، (عبدالرحمن بن روستم بن بهرام)، لە دەست فارس هەڵات چووە مەغریب، ئیمپراتۆریەتی ڕۆستەمی لە مەغریب دروست کرد لە (١٣٧-٢٩٧)[3]، لەسەردەمی عەبباسیەکان دەورێکی گرنگیشی بینی لە بڵاوکردنەوەی ئیسلام لەسەرووی ئەفریقیا ئەوە دوای ئەوە کوڕەکانیشی حوکمیان دەکرد، خەڵکی ئەوەندە پابەندی حوکم نەبووە، خەڵکی عەوام قایل بوون تەنها ناوی شازادەی لێ بنرابا، زۆر بەناگانەبوون هەتا ئیمپریالیزمە گەورەکان جار وابوو ئەو وڵاتانەیان دەفرۆشتەوە یەکتر، ئەمریکا (فلیپین)ی لە ئیسپانیا بە (٢٠) ملیۆن دۆلار کڕیەوە، چەندین ویلایەتی ئێستای کڕیەوە، ئیتحادیەکان

[1] نۆ هەموو بروانە: (موسوعة العربية ج٢ ل١٢٦). (موسوعة التأريخ الاسلامی، ج٤ ل٢٤٥). (موسوعة التأريخ الاسلامی ج٦ ل٥٠١).معجم البلدان - یاقوت الحموی هەروەها (إبن بەتروتە، نەخشەی هیرودتس، نبن الحوقل،....

[2] بە پێی خۆیان مانای خاکی پاکانە، بەڵام یەکێ لە گلەییەکانی بەنگلادیش (پاکستانی ڕۆژهەڵات) ئەوەبو کە پاك بریتیە لە پیتی یەکەمی ڕەگەزەکانی پاکستانی ڕوژ ناواو هیچ ڕەگەزێکی ئەوانی تیا نیە .

[3] موسوعة التاريخ الاسلامي. د.أحمد شلبي.

(لیبیا) یان هەراج کردبوو بە دوو کەشتی جەنگیی بدەنە ئیتالیا...، زۆربەی ئەو نیشتمانانە بی خاوەن بووینە سەودای وای لەسەر کراوە، ئەو کاتی پەیوەندی نیشتمانو نەتەوەو دەسەلاتی سیاسی لێك جیابوو، دوای لە سەردەمی ڕابوونی نەتەوەیی بە ئۆرگانیکیو سیاسیانە پێك بەستران، دوایش بوە مادەیەکی یاسای دەولی بۆ دروست بونی دەولەتی هاوچەرخ، بۆیە هەروەك نەتەوەییە عەرەبەکان هەڵەن کە وەسفی ئاشوریو ئەمەویو عەباسی بە عەرەبیانە دەکەن، مەغۆلو تەتەرو عوسمانی بە تورك، بەهەمان شێوەش هەڵەیە وەسفی ئەیوبییەکان: بە کوردایەتی بکرێت.

سەردەم سەردەمی نەتەوەیی نەبووە، سەردەمی ئیمپراتۆریاتو بنەماڵە بووە- ئەگەر ئیسلامی ڕاستەقینە نەبوبێ، ئیتر زۆرجار بە تەرازوویەکی ئەو واقیعەی ئێستا واقعێکی مێژوویی پێ هەڵدەسەنگێنین هەڵە دەردەچێ، وەك حوکم دان لەسەر (صلاح الدین) کە بۆچی دەولەتی کوردستانی دروست نەکردووە؟!!.

یان عەباسیو ئومەوی بۆ دەولەتی عەرەبیان دروست نەکردووە.. ئیتر ئەگەر وابوایە ئابوایە نەتەوەیە تورکەکان بە سەرکردایەتی ئەتاتورك شۆڕش لەسەر عوسمانی بکەن..

## هۆکارەکانی سەرهەڵدانی نەتەوەیی -پوختە-:

١- قۆناغی مێژووییو گەشەی زانستیو تەکنەلۆجی.

٢- غیابی ئاینی ڕاستەقینە.

٣- پەیدابوونی بۆشایی ئایدیۆلۆجیو باوەڕ لەدوای لاوازبوونی مەسیحیەت، وەك ڕەهەندی ئەوروپیەکەی.

٤- پێویستی مرۆڤ بە کۆمەڵێکی کۆمەڵایەتی بۆ ئینتماو تەفاعول کردن.

٥- گەشەی ئامرازەکانی فریودان بۆ پەیداکردنو ڕاکێشانی لایەنگیری سیاسی لەلایەن دەسەلاتداران.

٦- گەشەی عەلمانیەتو سیاسەتی مەزهەبی میکافیلی.
٧- پاڵنەرە ئیمپریالیزمیەکان.
٨- پاڵنەرێکی دەروونی هەیە بۆ مرۆڤ، کە ئارەزووی خۆ دەرخستنی هەیە، بەتایبەتی رەوشەنبیران، بۆیە هەر کاتێ لە ئینتما ئایدیۆلۆیو سیاسیو ئاینیو (ئاسۆییەکان بەگشتی) شکست بهێنێت بەخێرایی دەگەڕێتەوە بۆ ئینتمایە (شاقولیەکانی) وەك خێڵەکیو نەژادیو نەتەوەیی و.. ئەوەیان داینەمۆیەکی بەهێزی ورووژاندنو نوێ کردنەوەی ئەو هۆکارەیە بەسەر هەڵدانیشیەوە.
٩- لەناو هەمو نەتەوەیەکیش داستانو سەربردەیەکی ئەفسوناوی هەیە وەك سەروەریو یادکردنەوەیەکی نەتەوەیی، لەناو کوردو ئاریەکان (سەربردەی نەورۆز) کە زۆر روونیشە ناکەوێتە عەقڵی دروست، هەروەها (تۆرانیەتی) تورکی، (هرمجتونو شعب الله المختار)ی عبریو یهودی، أرض الرسالاتی عەرەب، (ئارام)یش لەناو ئەرمەنیەکان، بەسەربردەی واش بیری فاشی لە ئیتالیاو نازی لە ئەلمانیاو شۆڤینی فرنسی و فالانژیسی ئیسپانی... .

## جیاوازی نێوان دوو چەمك:

نومەو نەتەوە: لەلایەن نەتەوەگەریە عەرەبەکان تەقەلا دراوە نومەش بخرێتە ریز (قومیة)و خێل وبنەماله وخیزان هەروەك لە (کتاب الاخضر) بەروون تر هاتووە : الامة عبارة عن اسرة کبیرة بعد ان مرت بمرحلة القبیلة، بەو شێوەیە امە دەبتە زاراوەیەکی کۆمەلایەتی ستونی کەمێك فراوانتر لە نەتەوە، هەر بە سەرنجێکی سەرەتایی بەروونی دەردەکەوێ ئەو دوو چەمکە زۆر لێك جیان، کەچی زۆربەی نووسەرە نەتەوەییو فەرهەنگەکانیش یان بە ئەنقەست تێکەڵیان دەکەن یان لەژێر کاریگەری زانیاری تایبەتی ئەوروپی، نووسەرانی خۆشمان پێی بەهەڵەدا چووینە، لە فەرهەنگێکی باڵای وەك (الموسوعة العالمیة) کە بەو پلە نەتەوەگەریش نیە، کەچی ئاوای نەتەوایەتیو ئومەت تێکەڵ کردووە، سەرنج بدە

لە پێناسی نەتەوە، دەڵێ: (تعبير سياسي يعني شعور الناس بإنتماء جميعا الى أمة واحدة)[١]، بەهەمان شێوە (قاموس التربية) لە پێناسی (مادەی: nationalism —القومية: وعي قومي يركز على مجد الامة ثقافتها مصالحها)[٢]، هەروەهاله(القاموس السياسي)هاتووه : (..جملة عوامل معنوية التى تربط جماعة انسانية وتضمها فى ايطار وحدة تعرف بالوحدة القومية و تعرف هذه الجماعة باسم —الامة- .) زۆربەی ئاوا لێی بەهەڵە داچووینە.

تا رادەیەکی زۆر باویشی وەرگرتووە بۆیە فەیلەسوفێکی وەك (ئەنجلس)یش لە نووسینەوەی مەرجەکانی (ئومەت) گەڕاتەوە سەر هەمان مەرجەکانی نەتەوایەتی، لەدوای پشکنینێکی ورد لە زمانەکانی ئەڵمانیو ئینگلیزیو فەرەنسیو زۆربەیان وا دەردەکەوێ لە زمانی ئەوروپی ئەو دوو زاراوەیەی (نەتەوە)و (ئومە) بەیەك واتای (national) هاتووە، مەسیحیە نەتەوە گەریەکانی شام ولبنان یەکەم توێژ بوون کە دروشمی (العرب ثم الإسلام )یان بە کارهێنا ودامەزرینەری بیری نەتەوەی عروبیشن، لەوانە (بوتروس بیستانیو ئبراهیم یازچی ...نەجیب عازووری کتێبێکی بەناوی (يقظة أمة العربية) نووسی، ئومەی عەرەبیان هێنا ئاراوە لە جیاتی ئومەی ئیسلامی، ساتیع ئەلحوسەریش یەکەم کەس بوو (ناشینال)ی کردە (ئومە)و ئیتر (الامة العربية ) بەکارهات، ئەگینا لە هیچ کتابێکی کۆنی ئیسلامی ئەو زاراوەی ئومەی عەرەبی نادۆزیەوەبۆیە زۆریك لە ئەکادیمیە نەتەوەگەریە عەرەبەکانیش وا تێگەیشتون کە نیازی قورئان لە ئوومە ئومەی عەرەبە*، نەخێر، ئومە تەنها لە فەرهەنگی ئیسلامی مانای خۆی هەیە، ناوبردنی نەتەوەیەك بە (ئومە) بۆ باڵاو پیرۆزکردنی نەتەوەگەریەکەیە، جار وایە مارکسیەکانیش زاراوەی (ئومە)یان بەو کۆمەڵە

[١] الموسوعة العالمية، ق- ب/١٨ ل٤٢٧.
[٢] قاموس التربية: مادة (nationalism)، د.خولي.
* لە کوردستانیش بەشێك وای تێگەیشتوون

خەڵکە داوە کە شێوازی بەرهەم هێنانیان وەك یەك بووە، لە جیهانی سێیەمیش کێشەی پێناسو تێکەڵکردنی (ئوممە) بە (نەتەوە)و هەندێ جار بە (نیشتمان)یش، جاروایە بە نەتەوەیەکی سیاسی وتراوە (واتە: ئوممە= نەتەوە + ئایدیولۆژیا)، لە ڕووی یاساییەوە بە میللەتانێك وتراوە ئوممە کە دەوڵەتیان هەبوویی بۆیەش ناوی (أمم المتحدة) واهاتووە.

وەك ڕونە قەیرانی ڕەوشەنبیرانی جیهانی سێیەم لەو ڕووەوە ئەوەیە ئیعتمادێکی لاساییکەرەوەیان کردۆتە سەر ڕۆژئاوا بۆ ئەو پێناسانە، لەکاتێکا پێناسی (ئوممە) تەنها لە شەریعەتی ئیسلام و (مقاصد الشريعة) دەکرێ هەروەك (م.وات)یش دانی پیادەهێنێ‌و دەڵێ: (ئوممە تایبەتە بە ئیسلام‌و هیچ سیستەمێك نە پێی دروست دەبێ، نە بۆی دروست بووە)[١]، بۆیەش دەبینین لە (تەرجەمەی ناشین) بە نەتەوەو ئوممەو جاریش وایە بە نیشتمانیش هاتوە، تێکەڵ بوە، هەتا لە وەرگێڕانی (نازی- لە پیتەکانی یەکەمی پارتی سوشیالیستی نەتەوەیی ئەڵمانیا- naze) بەهەرسێ جۆر هاتووە (حزبی سوشیالیستی نیشتمانی ئەڵمانی)، بە (حزبی سۆشیالیستی نەتەوەیی ئەڵمانی)، بە (حزبی سوشیالیستی ئوممەی ئەڵمانی)ش هاتووە، ئوممە لە هەموو ئەوروپا دەگێڕنەوە بۆ (nation) کە هەمان مانای نەتەوەو جاروایە نیشتمانیش دەدا، کە ئەوەش لە ئەسڵدا لاتینییە لە (natio)، ئەوەش لە (noscere) هاتووە بە مانای (زان) یان (زاوزێ)یان لە (ناسیوم ونیتوس) هاتووە دەکاتە (مسقط رأس)، ئەو مانایانەش زیاتر ڕەچەڵەك دەگرێتەوە، بۆیە ئوممەش لە پۆلەکانی شاقوولی‌و نەتەوەیی خانەڕێژ کراوە، لە کاتێکا ئەسڵیەکەی لە ئیسلام ئوممەیە هیچ پەیوەندیەکی بە ڕەچەڵەك‌و زمان‌و نیشتمان نیە، بەڵکو تەنها لەسەر ئاینی هاوبەش پێك دێت، بۆیەش (عباس محمود عقاد) دەڵێ: نە (nation) نە (people) نە هیچ زاراوەیەکی ئەورووپی

---

١ بۆ زیاتر سەرنج بدە: ا- الاسلام و الجماعة المتحدة- وات، ب- مايقال عن الاسلام، ل٢٤٩.

(غەیرە ئیسلامی) مانای ئومە نادات[1]. پێناسی ئومە لە کتێبە کۆنەکانی ئیسلامی وەك: جرجانی، ئیبن مەنزوور، فەیروز ئابادی، ئەسفەهانی.. بەو کۆمەڵە خەڵکە وتراوە کە وەڵامی دەعوەی ئیسلامیان داوەتەوە، ئەوەش (واتە ئەو ئاینەش) لەو فەترەیەی سەدەی (١٩) بەدواوە کەمتر ئەو رۆڵەی مابوو زیاتر فەرهەنگی عەلمانی لە جیهانی ئیسلامیش زاڵ تر بووە، فەرهەنگە جیهانیەکانیش وەك (موسوعة دیدرۆ، ئەکادیمیەی فەرەنسی ١٦٩٤، فیختە، رینان، مارسیل، هیگل، نتچە، مارکس، ئەنجلس، لینین، ..) هەموو ئەوانە لەبارەیان نووسیە، خاكو زمانیان کردۆتە بنچینەی ئومە کە دوو فاکتەری نەتەوەییە، بۆیە دەبینین وا تێکەڵ کراوە، سەرنج بدە (د.کیالی) چۆن لە پێناسی نەتەوەیی (هەروەك پێناسی سەروو لە موسوعة العالمیة) گەیشتۆتە ئومە، (أمة: مجموعة بشرية تكون تآلفهما تجانسها القومي عبر المراحل تاريخية تحقق خلالها لغة مشتركة تاريخ تراث ثقافي معنوي وتكوين نفس مشترك والعيش على الارض واحدة مصالح اقتصادية مشتركة مما يؤدي الى احساس بشخصية قومية، و تطلعات ومصالح القومية موحدة مستقلة)[2]، ئەوەش بەدەقی لە فەرهەنگی (حزبی بەعس) هاتووە بروانە (تعريفات ببعض المصطلحات – مادة: امة).

ساطع حصری کە جیهان بینێکی عەرەبی نەتەوەگەریە دەڵێ (..لكن لا الدين ولا الدولة ولا حياة الاقتصادية من مقومات الامة الاساسية، ولكن اللغة و التاريخ هما عاملان الامة)، لە (موسوعة العربیة)ش کە (نوێترین و بەهێزترین موسوعەیە) دەڵێ (ئومە) بەیەك فاکتەر دروست نابێت، واتە تەنیا بە ئاین دروست نابێت[3]، دیسان لە (موسوعة العالمیة) لە پێناسی (نەتەوە) بە (ئومە) کۆتای هاتووە، ئومەش بە نەتەوە: (قومية: تعبير سياسي، يعني الشعور الناس

---

١ ما يقال عن الاسلام ل٢٤٩.

٢ الموسوعة السياسية ب١ ل٣٠٦.

٣ موسوعة العربية ب٣ ل٦٣٤.

بالأنتماء جميعا الى امة واحدة)، (امة: مجموعة من الناس يتقاسمون ثقافةء تاريخاء لغة مشتركةء لهم شعور بالوحدة القومية)[1]، له بارەی نەتەوەیی هاتووه (الدولة القومية: هي اذا تطابقت حدود الدولة مع حدود الامة نفسها)[2].

له ئەنثرۆپۆلوجیەکانیش هاتووه: ئومه به: ١-بەرژەوەندی هاوبەش، ٢- خاکی هاوبەش، ٣-شارستانی هاوبەش، ٤-مێژوو، ٥-زمان، ٦-ئاینی هاوبەش[3].

له موسوعەی (مذاهبء مفاهيم في فلسفةء الاجتماع- ل١٥ -كه پسپۆرپیشه لەوبارەیەوه -) هاتووه: (ان الامة مرتبط اشد الارتباط باللغة، ..)، ئەوەش هەرداکۆکی لـه: (زمـان، مێـژوو، ئـابووری، دەروونـی، کـەلتوور، ..) وەك مەرجەکانی ئومەی له قەلەم داوه، بەلاّم له دوایدا دێتەوه سەر ئەو راستکردنەوه دەڵێ : ئومەو نەتەوایەتی له ئیسلامدا لێك جیان.

لەپیناسێکی دەگمەن بۆ نەتەوایەتی له لایەن (کـارلتون هـیس) کـراوه تـەنیا تێروانینێکی ئایـدیۆلۆجی کردوتـه بنـچینه نـەك میـژوو وخـاك وزمـان ودەلی : (نەتەوەیی بریتیه له کۆمەله خەلکێك که تێروانینێکی هاوبەشیان بـۆ گـەردوون و ژیان هەیه)[4] ئەو پێناسه نزیکه له (ئومـه) نـەك نەتـەوه، پێناسـەکانی ئـەلمانیو فرنسی وڕووسی بۆئومه لێك جیایه، ئەلمانی توخمی ڕەچەلەك بنچینەیه، لەفرنـسا نیشتمان، لەڕوسی ئابوری،.. تێگەیشتنی عەرەبو تـورك سـەبارەت بـه نەتـەوه بۆتەلمانیەکه دەگەڕێتەوه، لەڕووی یاساییەوه بەشێك پێیان وایه ئومه ئەوانەن کـه خاوەن دەوڵەتن، (قاموس المصطلحات السياسية والدستورية والدولية) له مـادەی ئومـه دەڵێ: (مـشتقة مـن أصـل لاتـيني –nasci بمعنـى يولـد) سـەرنج بـده بنەچەکەشی بردوتەوه سەرلاتینی! ·

---

[1] موسوعة العالمية ب ١٨ ل٤٢٧.

[2] موسوعة العالمية ب ١٨ ل٤٢٧.

[3] مقدمة في أنثربولوجيا الاجتماعية.

[4] Easy of nationalism

بەشێکیش هەیە ڕاستتر بۆی چووینە لەوانە (موسوعة کشاف اصطلاحات فنون) دەڵێ ئوممەت تەنها لەسەر بنچینەی ئاین دروست دەبێت، ئەوەیان تێڕوانینی فکری ئیسلامیشە بەسەرجەم زاناکان وپسپۆڕی ئیسلامی لەو بوارە، (لە بابەتی چەمکەکانی فکری ئیسلامی تایبەت تر لە ئوممە دەدوێین)، ئەوکاتی بۆمان دەردەکەوێ هەروەك (ئومە) لەسەردەمی پێغەمبەر ﷺ چۆن (سەلمانی فارسی و صوهەیبی ڕۆمیو گابانی کوردیو بیلالی حەبەشی عومەری کوری خەتاب) یەك ئومەت بووینە، لەدوای ئەویش وا دروست بووە بەبێ هاوبەشی زمانو مێژوو و خاكو باری دەروونیو جیای کەلتوری.. ئاواش ئێستا دەبینین (ڕۆجیە غارودی، سعید نورسی، سید قطب، ابو أعلی مودودی، خمینی..) هەریەکە زمانی جیا، ئابووریو خاکی جیا، کەلتورو مێژووی جیا.. کەچی یەك ئوممەتیشن.. پێناسەکەش هەمو ئەوانەن کە پێشوازیو پەیڕەوی لە پەیامی محمد ﷺ دەکەن، (کل من بعث الیهم نبي، ویسمون امة الدعوة، وأخری علی المؤمنین به وهم امة الاجابة)[1]. یان وەك د.حمیدالله وەسفی کردووە: (ئومە: ئەوانەن وەلامی بانگی پێغەمبەر ﷺ دەدەنەوە لە هەر سەردەمێکو لەسەر بنچینەی ئەو وەلامە یەك دەگرن، تێ دەکۆشن)[2].

ڕاستە لە قورئانیش بەزۆر جۆر مانا هاتووە بە زەمەن، بە خەڵکی، بە مێژوو، .. بەڵام لە (مقاصد الشریعة) ئەو مانایانەی هەیە بە تەنها کە لە پێناسەکەی سەروو هاتووە، بۆیە هەندێکی تر ئوممەو ئوممەی ئیسلامیشیان لێك جیاکردۆتەوە، لەوانە (معجم اصول الفقه)، ئوممەی وەك ئەتەوە پێناسی کردووەو (ئوممەی ئیسلام)یش هەمو ئەوانەن کە باوەڕی بە پەیامی پێغەمبەر ﷺ هەیەو ئامانجی: (هي تحقیق الاستخلاف لله في الارض بعمارتها وفق منهج الله ومراده)[3]،

١ موسوعة کشاف مصطلحات فنون ل٢٠٦٢.
٢ الوثائق السیاسیة في عهد النبوي و الخلافة الراشدة.
٣ معجم مصطلحات أصول الفقه، د.قطب سانو.

